زنجیرەی گەنجینەی گەوهەر
( ٨ )

# ١٠٠ پرسیار

## دەربارەی

# مێژووی شارستانیەتی ئیسلامی




ئامادە کردنی
عبدالرحمن نجم الدين طه



چاپی یەکەم
١٤٢٠ك / ١٩٩٩ ز

بسم الله الرحمن الرحيم

## پرسیارەکان

پ١. (الفتح الأكبر) چی بوو ، کەی ڕوویدا ؟
پ٢. یەکەم تیرهاوێژ لە مێژووی ئیسلامدا کێبوو ؟
پ٣. یەکەم سەفیر لە مێژووی ئیسلامدا کێ بوو ؟
پ٤. یەکەم نوێژی هەینی ، کێ کردی و لە کوێ بوو ؟
پ٥. کام دوو ئەشکەوت لە مێژووی ئیسلامدا بەناوبانگن؟
پ٦. سەرۆکی دووروەکانی شاری (مەدینە) کێ بوو ؟
پ٧. بانگەواز لە مەککەدا چەند ساڵی خایاند ؟
پ٨. کەی وەفدی (نەجران) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ؟
پ٩. ئەو جێگایانەی لە وەختی فەتحی مەککەدا ئەمین بوون ، کوێ بوون ؟
پ١٠. کەی نوێژ بەم شێوەی ئێستای فەرزکرا؟
پ١١. کام پێغەمبەر بە (باوکی پێغەمبەران) ناسراوە ؟
پ١٢. بانگدان بۆ نوێژ لە کوێ دەستی پێ کرد ؟
پ١٣. لە کەیەوە (کەعبە) بوو بە قیبلەی موسڵمانان ؟
پ١٤. لە کەیەوە پێغەمبەر دەستی کرد بە نامە ناردن بۆ پاشایانی دەوروبەر ؟
پ١٥. ئەو نوێنەرە کوردەی کە خۆی گەیاندە پێغەمبەرو موسڵمان بوو ، کێ بوو ؟
پ١٦. کەی شەڕی (مؤتة) ڕوویدا ؟
پ١٧. کێ ئالاهەڵگری جەنگی ئوحود بوو ؟
پ١٨. دوا غەزا کە پێغەمبەر ﷺ تیایدا بەشدار بوو ، کامە بوو ؟
پ١٩. پەیمانی حودەیبیە لە کوێ و کەی بەسترا ؟
پ٢٠. یەکەم ماڵی خوا کە لە زەویدا دروست کراوە ، کامەیە ؟

# وەلامەکان

و ١/ فەتحی مەککەی پیرۆز بوو ، لە رەمەزانی ساڵی (٨ک) دا
و ٢/ سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص – خوای لیّ رازی بێت–
و ٣/ موصعەبی کوڕی عومەیر – خوای لی رازی بێت–
و ٤/ پێغەمبەر ﷺ کردی ، لە (بەنی سالم) لە مەدینەی پیرۆز
و ٥/ ئەشکەوتی (حەراء) و ئەشکەوتی (ثەور)
و ٦/ عەبدوڵلای کوڕی نوبەی
و ٧/ سیانزە ساڵ .
و ٨/ لە ساڵی (٩) ی کۆچیدا
و ٩/ کەعبە – ماڵی ئەبو سوفیان – هەر کەسەو ماڵی خۆی
و ١٠/ لە شەوی میعراجی پیرۆزدا
و ١١/ ئیبراهیم پێغەمبەر – سەلامی خوای لەسەر بێت
و ١٢/ لە شاری مەدینەی پیرۆزەوە
و ١٣/ پاش شەش مانگ لە هیجرەت بۆ مەدینە
و ١٤/ لەدوای صوڵحی (حودەیبیە)
و ١٥/ (جاوان) یاخود (کاوان)ی کوردی بوو – خوای لی رازی بێت
و ١٦/ لە ساڵی هەشتەمی کۆچی دا
و ١٧/ موصعەبی کوڕی عومەیر خوای لی رازی بێت
و ١٨/ غەزای (تەبوک)
و ١٩/ لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا ، لەسەر زەوی (حودەیبیە) لە سنوار مەککە و مەدینەدا
و ٢٠/ مزگەوتی (الحرام) لە مەککە واتە کەعبەی پیرۆز

پ٢١ـ جەنگی (خەیبەر) کەی ڕوویدا ؟
پ٢٢ـ جەنگی (خەندەق) بۆ وا ناونراوە ، کەی روویدا ؟
پ٢٣ـ حوکمی ئیسلامی لە ساڵی چەندا لە ئەندەلوس کۆتایی پێ هات؟
پ٢٤ـ لە کام جەنگی سەردەمی پێغەمبەردا ، بە هۆی نەخۆشی لە خۆبایی بوونەوە ، موسڵمانەکان شکان ؟
پ٢٥ـ لەکام جەنگدا صەلاحەددین خاچپەرستەکانی شکاند ؟
پ٢٦ـ یەکەم کەس و دواکەس کە قودسی ڕزگارکرد کێ بوو ؟
پ٢٧ـ کێ مێژووی کۆچی داهێنا ؟
پ٢٨ـ کێ یەکەمین کەس دراو (سکە) ی ئیسلامیی لێداوە ؟
پ٢٩ـ غەزای قادسیە بە فەرماندەیی کێ بوو ؟
پ٣٠ـ دیوانی سەربازیی (دیوان الجند) کێ وکەی دایمەزراند ؟
پ٣١ـ کێ فەرماندە بوو لە ڕزگار کردنی میسردا ؟
پ٣٢ـ کەوتنی ئاڵا لە کاتی شەڕدا نیشانەی چی بوو ؟
پ٣٣ـ لە ساڵی چەندا ناوچەی (نەهاوەند) ڕزگار کرا ؟
پ٣٤ـ جەنگی‌نەهاوەند بەچ ناوێک مەشهورە لە مێژوودا و بۆ ؟
پ٣٥ـ شاری بەسرە لە ساڵی چەنداو لە سەردەمی کێدا دروست کرا ؟
پ٣٦ـ خەلافەتی حەسەنی کوڕی عەلی چەندەی خایاند ؟
پ٣٧ـ کێ شاری (فوسطاط) ی بینیاتنا لە وڵاتی میسردا ؟
پ٣٨ـ کەی و لە کوێ حەزرەتی حسین شەهید کرا ؟
پ٣٩ـ یەکەم کەس کە بەیعەتی دا بە حەزرەتی حسین کێ بوو ؟
پ٤٠ـ پایتەختی دەوڵەتی ئەمەویەکان کوێ بوو ؟

و٢١/ لەساڵی حەوتەمی کۆچی دا .
و٢٢. لە ساڵی ( ٥ ک ) دا ، چونکە موسڵمانەکان بە دەوری مەدینەدا خەندەقییان هەڵکەند . .
و٢٣/ لەساڵی (١٤٩٢ز) دا، خاچپەرستەکان ئەندەلوسیان داگیرکرد.
و٢٤/ لە جەنگی (حونەین) دا ، [ ویوم حنین اذ اعجبتكم كثرتكم ] .
و٢٥/ لە جەنگی (حطین) دا کە لە گوندی (حطین) لە فەلەستین لە (١١٨٧ز) دا ڕوویدا . .
و٢٦/ یەکەم : خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب/دووەم : سەلاحەددینی ئەیوبی . . انشاء الله جارێکی تریش بە یەکجاریی ڕزگار دەکرێتەوە .
و٢٧/ حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێت– .
و٢٨/ حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب – خوای لێ ڕازی بێت– .
و٢٩/ (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) – خوای لێ ڕازی بێت– .
و٣٠/ حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب – لە ساڵی ( ٢٠ ) کۆچیدا .
و٣١/ عەمری کوڕی عاص – خوای لێ ڕازی بێت .
و٣٢/ نیشانەی شکانی ئەو لەشکرە بووە . و٣٣/ لە ساڵی (١٩) ی کۆچیدا .
و٣٤/ بە جەنگی (فتح الفتوح) چونکە ریشەی دەوڵەتی ساسانی تیادا دەرهات .
و٣٥/ لە ساڵی ( ٦٣٨ ز) و لەسەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابدا .
و٣٦/ تەنها ماوەی شەش مانگ .
و٣٧/ عەمری کوڕی عاص – خوای لێ ڕازی بێت
و٣٨/ لە ڕۆژی عاشوراءی ساڵی ( ٦٨٠ ز) دا لە کەربەلاء.
و٣٩/ قەیسی کوڕی ساعدی ئەنصاری بوو .
و٤٠/ لە شام دا (دیمەشق) و لە ئەندەلوسیشدا (قورتوبە) بوو .

پ٤١ـ دیوانەکانی دەوڵەت لە سەردەمی ئەمەویەکاندا ، چی بوون؟
پ٤٢ـ کێ دەوڵەتی ئەمەوی دامەزراند ؟
پ٤٣ـ دەوڵەتی ئەمەوی بە ناوی کێوە ناونرا ؟
پ٤٤ـ یەکەم خەلیفە کەحیمایەو پاسەوانی بۆ خۆی دانا کێ بوو ؟
پ٤٥ـ کام کۆمەڵ خەلافەتی پشتاو پشت (وراثی) یان داهێنا ؟
پ٤٦ـ پاشا رۆمی‌یە هاوسەردەمەکانی حەزرەتی معاویە کێ بوون ؟
پ٤٧ـ (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیک) چەند ساڵ خەلیفە بوو ؟
پ٤٨ـ کەی (حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی) کۆچی دوایی کرد ؟
پ٤٩ـ (عومەری کوڕی عبدولعەزیز) چەند ساڵ خەلیفە بوو ؟
پ٥٠. (عبدولمەلیکی کوڕی مەروان) لە ساڵی چەند دا لە دایکبووە ؟
پ٥١ـ ئەمارەتەکانی دەوڵەتی ئەمەوی کامانە بوون ؟
پ٥٢ـ کێ فەتحی سەرزەمینی (ئەندەلوس) ی کرد ؟
پ٥٣ـ جەنگی (ذات العیون) بۆ وا ناونراوە ؟
پ٥٤ـ رەنگی ئاڵای دەوڵەتی ئەمەوی چۆن بوو ؟
پ٥٥ـ گەورەترین مزگەوت کە ئەمەویەکان لە شام دا دروستیان کرد کامەیە ؟
پ٥٦ـ عومەری کوڕی عبدولعەزیز لە پاش کێ بوو بە خەلیفە ؟
پ٥٧ـ ئەمەویەکان چەند خەلیفە بوون ، لە شام ولە ئەندەلوس دا ؟
پ٥٨ـ کام پاشا ئەو کاغەزەی پێغەمبەر ﷺ بۆی نارد ، بێ شەرمانە دڕاندی ؟
پ٥٩ـ کام خەلیفە بە (پێنجەمین خەلیفەی راشیدین) ناسراوە ؟
پ٦٠ـ دوا خەلیفەی ئەمەوی لە ئەندەلوسدا کێ بوو ؟
پ٦١ـ یەکەم جوگرافیناسی موسڵمان کێ بوو ؟
پ٦٢ـ کەی ولەکوێ (هارون الرشید) لەدایکبووە ؟

و٤١/ دیوانی : سەربازیی – خەراج وباج – نامەکان
و٤٢ـ معاویەی کوڕی ئەبو سفیان .
و٤٣/ بە ناوی (ئومەییەی کوڕی عەبدولشەمس) ەوە .
و٤٤/ معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو .
و٤٥ـ ئەمەویەکان بوون .
و٤٦/.قوستەنتینی دوەم و قوستەنتینی چوارەم .
و٤٧/ نۆسالٚ و هەشت مانگ .
و٤٨/ لە مانگی شەوالی سالٚی ( ٩٥ک) دا .
و٤٩/ دووسالٚ و پێنج مانگ و چوار ڕۆژ .
و٥٠/ لەسالٚی (٢٦) ی کۆچیدا .
و٥١/ حیجاز۔ عێراق – دوورگەی عەرەب – دەڤەری شام – میسر سەرووی ئەفریقیا – ئەندەلوس .
و٥٢/ موسای کوڕی نەصیر .
و٥٣/ چونکە تیر هاوێژە موسلٚمانەکان بە تیرو چاوی هەزار بێ باوەڕیان لە شەرەکەدا کوێر کرد !!
و٥٤/ سپی بوو ..
و٥٥/ مزگەوتی (ئەمەوی) یە لەشاری (دیمەشق) دا .
و٥٦/ لە پاش خەلیفە (سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک) .
و٥٧/ لە شامدا (١٣) خەلیفە و لەئەندەلوسیشدا (١٦) خەلیفە بوون .
و٥٨/ کیسرای پاشای ساسانیەکان بوو .
و٥٩/ خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز – خوای لێ رازی بێت– .
و٦٠ / خەلیفە (هشامی سێیەم) بوو کەبە (المعتد بالله) ناسراوە .
و٦١/ (یەعقوبی) بوو – کەلەکۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچیدا ژیاوە .
و٦٢/ لە سالٚی ( ١٤٥ک) لە (رەی) نزیکی بەغداد لە دایکبووە .

پ٦٣ـ یەکەم خەلیفەی عەبباسی کێ بوو ؟
پ٦٤ـ دوا خەلیفەی عەبباسی کێ بوو ؟
پ٦٥ـ خەلیفە (مەئمون) کوڕی کام خەلیفە بوو ؟
پ٦٦ـ هارون الرشید لە ژیانیدا چەند حەجی کردووە ؟
پ٦٧ـ کەی ئەبو جەعفەری مەنسور بوو بە خەلیفە ؟
پ٦٨ـ کەی و لەکوێ ئەبوجەعفەری مەنسور کۆچی دوایی کرد ؟پ٦٩ـ گەورەترین و یەکەمین وەزیری خەلیفە هارون کێ بوو ؟
پ٧٠ـ لە سەردەمی (هارون الرشید) دا پاشای فەرەنسا کێبوو ؟
پ٧١ـ لە سەردەمی عەبباسی دا ، لە میسر چ دەولەتێک هەبوو ؟
پ٧٢ـ کەی دەولەتی (سلجوقی) هەلوەشایەوە ؟
پ٧٣ـ کام خەلیفە و لە سالی چەندا شاری (بەغداد) ی بنیاتنا ؟
پ٧٤ـ عەبباسیەکان کەی دەولەتەکەیان دامەزراند ؟
پ٧٥ـ دەولەتی عەبباسی چەند سالٚ بەردەوام بوو ؟
پ٧٦ـ دەولەتی (عەبباسی) بە ناوی کێوە ناو نرا ؟
پ٧٧ـ کەی مەغۆلەکان شاری (بەغداد) یان داگیر کرد ؟
پ٧٨ـ لەشکری ئیسلام کە ساسانیەکانی روخاند ، بە فەرماندەیی کێ و ژمارە یان چەند بوو ؟
پ٧٩ـکێ بەردە رەشەکەی کەعبەی دزی وکەی ؟
پ٨٠ـ کێ وکەی پایتەختی لە بەغدادەوە گواستەوە بۆ (سامەراء) ؟
پ٨١ـ کێ مەدرەسەی (المستنصریة) ی لە بەغداد دامەزراند ؟
پ٨٢ـ ژمارەی خەلیفە عەبباسیەکان چەند بوون ؟
پ٨٣ـ کام کۆمەلٚ فیتنەی(خلق القران) یان هێنایە کایە ؟
پ٨٤ـ کێ (بیت الحکمة) ی دامەزراند و ئیشی چی بوو ؟

و٦٣/ ئەبولعەبباسی سەففاح بوو
و٦٤/خەلیفە (المستعصم باللە) بوو
و٦٥/ کوڕی هارون الرشید وبرای خەلیفە (ئەمین) بوو
و٦٦/ نۆ جار حەجی کردووە
و٦٧/ لە ساڵی (٧٥٤) ز دا
و٦٨/ لە حەجدا ، لە ساڵی ( ١٥٨ک) دا
و٦٩/ یەحیای بەرمەکی بووە
و٧٠/ پاشا (شارلمان ی کوڕی باین) بوو
و٧١/ دەوڵەتی (مەمالیک)
و٧٢/ لە ساڵی (٤٩٠) ی کۆچی ، بەدەستی خوارەزم شا
و٧٣/ خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسور — لە ساڵی ( ٧٦٢ز) دا
و٧٤/ لەساڵی (١٣٢ی کۆچی) دا و٧٥/ (٥٢٣ ساڵ )
و٧٦/ بە ناوی (عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب) خوای لێ ڕازی بێت— .
و٧٧/ لەساڵی ( ٦٥٦) ی زاینییدا
و٧٨/ بەفەرماندەیی خالیدی کوڕی وەلیدو ژمارەیان (١٨ ) هەزار کەس بوو
و٧٩/ (القرامطة) دزیان ، لەساڵی ( ٩٣٠ز) دا (٢٢ ساڵ) شاردیانەوە
و٨٠/ خەلیفە موعتەصەمی عەبباسی ، لە ساڵی ( ٨٣٦ ز) دا
و٨١/ خەلیفە (المستنصر باللە) ی عەبباسی
و٨٢/ (٣٧ خەلیفە) و٨٣/ کۆمەلی ( موعتەزیلە)
و٨٤/ خەلیفە مەئمون .. بۆ وەرگێڕانی بەرهەمی زمانەکانی تر بە تایبەتی یۆنانی .

پ٨٥. ژمارەی سوڵتانە عوسمانیەکان چەند بوون ؟
پ٨٦. کێ دەوڵەتی عوسمانی دامەزراند ؟ کەی ؟
پ٨٧. کێ فەتحی قوستەنتینییەی کرد ؟ کەی ؟
پ٨٨. کەی وکێ دەوڵەتی فاطمی لە میسر روخاند ؟
پ٨٩. صەلاحەددینی ئەییوبی ناوی چی یە ؟ لەکوێ لە دایکبووە ؟
پ٩٠. کێ رێبازی نەقشبەندی لە کوردستاندا دامەزراند ؟
پ٩١. کێ وکەی (الجماعة المسلمة) ی لە پاکستان دامەزراند ؟
پ٩٢. ئەو کەلە موجاهیدە لیبیەی کە ئیطالیەکان ئیعدامیان کرد کێ بوو ؟
پ٩٣. کەی خەلافەتی ئیسلامیی هەڵوەشێنرایەوە ؟
پ٩٤. کێ زانکۆی ئەزهەری لە میسر دامەزراند و کەی ؟
پ٩٥. کەی ئیمام (حەسەن بەننا) شەهید کرا ؟
پ٩٦. کەی شۆڕشگێڕی موسڵمانی کورد (شێخ سەعیدی پیران) لە دار درا ؟
پ٩٧. ئەو مێژونووسە کوردە کێیە ، کە کتێبی (وفیات الأعیان) ی داناوە؟
پ٩٨. مزگەوتی (ئەیاصۆفیا) کە کەنیسە بوو ، کێ کردی بە مزگەوت و لە کوێیە ؟
پ٩٩. کێ کۆمەڵەی (العروة الوثقى)ی دامەزراند ؟
پ١٠٠. کێ بانگەشەی کرد بۆ دامەزراندنی زانکۆیەکی گەورە بە ناوی (الزهراء) لە تورکیا ؟

و ٨٥/ (٣٧ سولّتان)
و٨٦/ عوسمانی کوڕی ئەرطغرول ، لە ساڵی (١٢٨١ ز) دا
و٨٧/ سولّتان (محمدی فاتح) لە ساڵی (١٤٥٣ ز) دا
و٨٨/ صلاحەددینی ئەییوبی – لە ساڵی (١١٧١ ز) دا
و٨٩/ ناوی (یوسف کوڕی ئەییوب) ەولە (تکریت) لەدایکبووە
و ٩٠/ مەولانا خالیدی نەقشبەندی – رەحمەتی خوای لێ بێت–
و ٩١/ ئەبولئەعلای مەودودی – رەحمەتی خوای لێ بێت–
و٩٢/ (عومەر موختار) بوو
و٩٣/ لە ساڵی (١٩٢٤ ز) دا
و٩٤/ خەلیفە (المعز لدين الله) ی **فاطمی** لە ساڵی (٩٧٢ز)
و٩٥/ لە (شوباتی ساڵی ١٩٤٩ز) دا
و٩٦/ (١٩٢٥ز)
و٩٧/ ئیبن خەلەکان .
و٩٨/ لە (ئەستەنبوڵ)ە ، سولّتان محەممەدی دووەمی عوسمانی
و٩٩/ سەیید جەمالەددینی ئەفغانی
و ١/ بەدیعوزەمان (سەعیدی نوورسی)


سەرچاوەکان :

١- الكامل في التاريخ – ابن الأثير ٢- البداية والنهاية – ابن كثير

٣- تأريخ الامم الاسلامية – محمد خضري بط

٤- صراع الأفكار ... د.محسن عبدالحميد

٥- المنجد في الاعلام

# ئەم نامیلکە

وەلامی (١٠٠) پرسیاری هەمەرەنگە سەبارەت بە قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی مێژووی شارستانیەتی ئیسلامیی ئەو مێژووە زێرینەی کە بە صەدان و هەزاران کتێبی لەسەر بنووسرێت هێشتا هەقی خۆی پێ نەدراوە و شایانی لێکۆڵینەوەو لەسەر نووسینی زیاترە .. ئەوەی لەم نامیلکەدا خراوەتە روو تەنها نمێکە لە ئۆقیانووسی ئەو مێژووە دەوڵەمەندە .. بە هیوام خوێنەرانی هێژا سوودی لێ ببینن و ، مشتێکم خستبێتە سەر خەرمانی زانست و زانیاریان ...

ژمارەی سپاردنی هەموو ئەڵقەکانی
(زنجیرەی گەنجینەی گەوهەر )
٢٤٥ بۆ ساڵی ١٩٩٨